# وەسیەتنامەی شەرعی

نووسینی

**دکتۆر : کەمال صادق یاسین**

مامۆستا لە کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان

لە هەولێر

٢٠١٣ی زایینی

١٤٣٥ی کۆچی

٢٧١٣ی کوردی

چاپی یەکەم

# وەسیەت نامەی
# شەرعی

نووسینی

**د . کمال صادق یاسین**

مامۆستا لە کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان ـ هەولێر

٢٠١٣ زایینی

١٤٣٥ کۆچی

٢٧١٣ کوردی



**پێشەکی :**

سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە داوای یارمەتی و کۆمەک و لێخۆشبوونی لێدەکەین، و پەنای پێ دەگرین لە خراپەی دەروون و کارو کردەوەمان، هەرکەسێک خودای گەورە هیدایەت ورێنموونی بکات بۆ سەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام، کەس ناتوانێت گومڕای بکات، وە هەرکەسێکیش ئەو گومڕای بکات (بەهۆی کاروکردەوەی خراپی خۆیەوە) کەس ناتوانێت هیدایەتی بدات و ڕێنمونی بکات، شاهیدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوای گەورە و پەروەردگار (الله)، و هیچ شەریک و هاوەڵێکی نییە، وە شاهیدیش دەدەم موحەمەد بەندە و پێغەمبەری خودایە ﷺ .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾[1]

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ

---

(١) آل عمران: ١٠٢.

رَقِيبًا ﴿١﴾[٢] ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾[٣].

**پاشان سەڵات و سەلام لەسەر سەروەری گشت پێغەمبەران، گەورەو پێشەواو ڕابەرمان موحەمەدو ئال و بەیت و یاوەران و شوێنکەوتووانی بێت تا ڕۆژی قیامەت.**

**خۆشەویستان: مردن بە پیری و گەنجی نییە، مردن بەوە نییە کە تەنها کەسی نەخۆش، یان پیر و پەککەوتە ببات لەگەڵ خۆی، نەخێر سوێند بێت بەخوا هەموو کەسێک لە ئێمە درەنگ بێت یان زوو تامی دەچەژێت و پێی دەگات، وە لەبەرئەوەی کە هیچ کەسێک لە ئێمە نازانێت چ کاتێک مردن دەبێتە میوانی و چ کاتێک یەخەمان دەگرێت، پێویستە لەسەرمان پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێت وەسیەتی شەرعی خۆمان ئامادە کردبێت.**

**وە لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری موسڵمانان شارەزا نین لە بابەتی وەسیەتکردن و ئادابەکانی، بەهۆی سەرقاڵی و بەدواکەوتنی دونیای**

---

[٢] النساء: ١.

[٣] الأحزاب: ٧٠-٧١.

فانی و نەبونی زانستی شەرعی لەبەر نەبوونی وەسیەتنامە؛ بۆیە بەپێویستم زانی نامیلکەیەکی پوختە بە کوردی و کورتی بنوسم دەربارەی ئەم بابەتە گرنگ و چارەنووس سازە کە چاوەڕێی گشت لایەکمان دەکات، تیایدا باسی چۆنیەتی وەسیەتکردنی شەرعی و حوکمەکەی و مەرج ئادابەکانی بەگوێرەی دەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پیغەمبەری خودا ﷺ وە ڕوونکردنەوەی گەورە زانایانی شەریعەتی ئیسلام لەم بوارەدا بخەینە بەرباس و لێدوان.

بەڕێزان: دیارە بابەتی وەسیەت کردن لە کتێبەکانی فیقهی ئیسلامی زۆر بە دورو درێژی باس کراوە، بەڵام من مەبەستم زیاتر باسکردنی لایەنە ئیمانی و ڕۆحی یە، وەک ئامۆژگاری و خۆئامادەکردن بۆ سەفەری مردن و ماڵئاوایی یەکجاری لە دونیا بە زادو زەخیرەو توێشوی چاکەوە، وەبەبیر هێنانەوەی براو خوشکانی ئیماندارم بۆ نوسینی وەسیتنامەیەکی گرنگی شەرعی، تا لە دوای خۆیان جێبەجێ بکرێت وە بەتایبەتی لە سەردەمێکی وەک ئێستا کەبیرمان بۆ مردن زۆر لاوازە؛ وەتەمەنی درێژی دونیا بەتەمەنی خۆمان دەزانین، وە مردن بەدور دەبینین لە خۆمان، و بەوشێوەی پێویستە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا ناکەین، وە دیارە خۆئامادەکردن بۆ مردن یادکردنەوەی سیماو نیشانەو ڕەوشتی پیاوچاکانە.

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە دین و ئیمانمان سەلامەت بکات،و ئاخر خێریمان بەقیسمەت بکات، و دونیا جێنەهێلین بەبێ نوسینەوەی وەسیەت نامە، و هەڵسان بەئەنجامدان و جێبەجێ کردنی گشت حەق و مافەکانی خۆمان و هی خەڵکانی تر لە ئەستۆمان، تا لە ڕۆژی قیامەتدا گەردنمان ئازاد بێت و ئۆبالی کەسمان لەمل نەبێت و پەشیمان نەبین، زۆر جاران کەسوکاری مردوی کۆچکردو دەکەونە گێژاو گومان دەبارەی قەرزو حەق و مافەکانی مردووەکەیان لەبەر نەبون و نەنووسینی وەسیەتنامەی ڕوون و ئاشکرا، بۆیە پێویستە مرۆڤی بڕوادار درێغی نەکات لە نوسینی وەسیەتنامە.

نووسەر

هەولێر - ٩٤ گوڵان

٢٦ موحەرەمی ١٤٣٥ کۆچی

٢٩ تشرینی دووەمی٢٠١٣ زایینی

## پێناسەی وەسیەت :

وەسیەتکردن بریتیە لە بەخشینی مافێک کە لە دوای مردن جێبەجێ بکرێت.

لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە وەسیەت کردن بەماڵ بۆ دایک و باوک و خزمان واجب بوو، بەڵام بە ئایەتەکانی میرات دابەشکردن حوکمی واجب بوونەکەی (نەسخ) بووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری سوننەتی وەسیەت کردن لە سێیەکی ماڵ و ساماندا هەر بەردەوام ماوەتەوە.

ئازیزان: لەسەر هەموو موسڵمانێکی باڵغی عاقڵ، نێر بێت یان مێ، گەنج بێت یان پیر، پێویستە پێش مردنی ئەم وەسیەتە شەرعیە بکات، بۆ ئەوەی خزم و کەسوکارەکەی پاش مردنی جێبەجێی بکەن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووە، ئومێدەوارم لەو کەسانەی ئەو وەسیەت نامەیە دەخوێننەوە هەستن بە بڵاوکردنەوەی لەناو چین و توێژەکانی کۆمەڵگەدا، نەک تەنها لە ووتاري مامۆستایان و پێگەو ماڵپەڕە ئەلکترۆنیەکاندا، بگرە لە مزگەوت و شوێنە گشتیەکانیشدا، بۆ ئەوەی خەڵکانێکی زیاتر سوودی لێوەربگرن و لە ناوەڕۆکەکەشی تێبگەن و حاڵی ببن، هەتا بە یارمەتی خوای گەورە بەهەموو لایەکەوە بتوانین ئەم سوننەتە فەرامۆشکراوە لەنێو کۆمەڵی باوەڕداراندا زیندوو بکەینەوە.

## بەڵگەکانی مەشروعیەتی – دروستی- وەسیەتکردن :

لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا وەسیەت کردن کارێکی مەشروع و ڕێگا پێدراوە بە پێی دەقەکانی قورئانی پیرۆز، و فەرموودەی سەحیحی پێغەمبەری ئازیز ﷺ، و کردەوەی هاوەڵانی بەڕێز، و کۆدەنگی زانایانی ئیسلامی لەسەرە :

**یەکەم** : بەڵگە لە قورئانی پیرۆز : خوای گەورە لەبارەی وەسیەتەوە فەرموویەتی : ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾[٤]، واتا: خوای گەورە لەسەرتانی پێویست کردووە کاتێک یەکێکتان نزیکی سەرەمەرگ بوونەوە و ماڵی هەبوو لێی بەجێما، بە جوانی و ڕێکوپێکی وەسیەت بکات بۆ باوک و دایکی و خزمانێک کە بەشیان بۆ دیاری نەکراوە.

**دووەم** : بەڵگە لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ :

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿ ما حق إمريء مسلم له شيء يوصي فيه يبيت ليلتين إلا ووصيته

---

([٤]) البقرة : ١٨٠.

مکتوبــة عـــــنده ﴾(٥)، واتــا: حــەق نییــە بــۆ هــیچ کەسـێکی موسڵمان ئەگـەر شتێکی هەبێت و بیەوێت وەسیەتی تێدا بکات دوای مردنی، دوو شەوی بەسەردا بـڕوات مەگـەر وەسـیەتەکەی لای خۆی نووسرا بێت و لەژێرسەریدا بێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش (خوا لێیان ڕازی بێت) لـەبارەی وەسیەتەوە ووتویەتی: ﴿ما مرت علي ليلة منذ سـمعت رسـول الله قال ذلك، إلا وعندي وصيتي ﴾(٦)، واتا: لەوەتەی گوێم لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خـوا بـووە ﷺ دەربـارەی وەسـیەت، هیچ شەوێک بەسەرمدا تـێ نەپـەڕیوە کـە وەسـیەتەکەم لـەپاڵ خۆم دانەنابێت .

هــەروەها پێغـەمبـەری خوا ﷺ فەرموویـەتی: ﴿المحــروم مــن حرم الوصية، ومن مات على وصية مات على سبيل وســنة، ومــات على تقى وشهادة، ومات مغفورا له﴾(٧)، واتــا: بێبـەش ئـەو کەسـەیە کـە وەسیەت ناکات و فریای ناکـەوێت، وە هەرکەسـێک بـە وەسـیەتەوە بمرێت، ئەوا لەسـەر ڕێبـازو سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ و خواناسـی و شەهادەت و لێخۆشبوون وەفاتی کردووە .

---

(٥) رواه الشيخان .

(٦) رواه مسلم.

(٧) رواه ابن ماجه .

**سێهەم** : بەڵگەکان لە کردەوەی هاوەڵانی بەرێز:

هـاوەڵانی بـەرێز (خـوا لـە هـەموویان ڕازی بێـت) لـە پێنـاو ڕەزامەندی خوای گەورە ﷻ بە بەخشینی بەشێک لـە مـــاڵ و سامانیان وەسیەتیان دەکرد .

**چوارەم** : بەڵگەی کۆدەنگی زانایانی ئوممەتی ئیسلام :

هەر لە سەردەمی هاوەڵانی بەرێز و پاش ئەوانیش لە هـەموو چەرخ و سەردەمێکدا زانایـانی ئیسـلام کۆدەنـگ بـوون لەسـەر دروستی و مەشروعیەتی وەسـیەت کـردن، وە نەبیسـتراوە لــە هیچ کامیان کە ڕێگریان کردبێت لەوەها کارێک.

موسڵمان واجبە لەسەری تا لە ژیانیدایە، هەرچی هەق و مافێکی خەڵکی تـری بەسـەرەوەیە بیانداتـەوە و بۆیـان بگەڕێنێتـەوە، نـەک پشتگوێیان بخات و خۆی لێیان گێل و بێ ئاگا بکـات تـاکو نزیکـی سەرەمەرگ دەکەوێتەوە، ئەوجا وەسیەت بـۆ کەسـوکارەکەی بکـات بە دانەوەی.

ئـەو کەسـەی کـە توانـای گرتنـی ڕۆژووی هەیـە، یـان توانـای ئەنجامدانی حەجی هەیە، نابێت وەسیەت بکات بەوەی پاش مردنی بۆی بکرێت، بەڵکو لەسەری واجبە ئەو ڕۆژووانەی کە قەرزار بووە لەبەر هەر هۆیەک بووە و نەیتوانیوە بیانگرێـت خـۆی تـا لەژیاندایـە

بیانگرێتەوە، یان دەبێت تاخۆی لە ژیاندایە حەجی ئیسلام بکات، نەک وەسیەت بکات پاش مردنی حەجێکی بۆ بکەن .

ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەم فەرموودەیە (مەبەستی فەرموودەی عەبدوڵلای کوڕی عومەری پێشووە)هانی موسڵمانان دەدات لەسەر وەسیەت کردن پێش مردن، موسڵمانانیش کۆدەنگن لەسەر فەرمان پێکردنی، بەڵام مەزهەبی ئێمە، واتا مەزهەبی شافیعی و مەزهەبی جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن وەسیەت کردن سوننەتە نەک واجب، ئیمامی داود و جگە لەویش لە کەسانی زاهیری بەلایانەوە واجبە کە موسڵمان پێش مردنی وەسیەت بکات، بەڵام لەڕاستیدا ئەم فەرموودەیە بەڕاشکاویی نەیفەرموە کە وەسیەت نووسینەوە واجبە، بەڵام مرۆڤ ئەگەر هاتوو قەرزێکی لەسەر بوو، یان مافی کەسێکی تری بەسەرەوە بوو، یان ئەمانەت و سپاردەیەکی خەڵکانێکی تری لابوو، ئەوا لەم کاتەدا واجب دەبێت لەسەری کە وەسیەت بکات بۆ خزم و کەسوکارەکەی، ئەو هەق و ماف و سپاردانەی لایەتی بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان[٨] .

---

[٨]) شرح النووي على صحيح مسلم: ٧٤/١١.

## حیکمەتی وەسیەتکردن:

بەپێی بنەما گشتیەکانی شەریعەتی ئیسلام بێت وەسیەت کردن دروست نییە، لەبەرئەوەی دەستخستنە ماڵیەتی پاش مردنی، لەگەڵ ئەوەی کەماڵەکەی پاش مردنی دەبێتە ماڵی کەسانی تر کەمیراتی لێ دەبەن، بەڵام وەک زیادە خێرو ڕەحمەتێکی خودا بە بەندەکانی وە لەبەربەرژەوەندی گشتی وسوودو قازانجی وەسیەتکارو وەسیەت بۆکراوو کۆمەڵگەش بەگشتی خوای گەورەو میهرەبان ڕێگای داوە ئەو کەسە وەسیەت بکات بۆ خزم وکەسی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە خێرو چاکانە دوای مردنی مرۆڤ.

## جۆرەکانی وەسیەت :

وەسیەت کردن چوار جۆرە :

یەکەم : وەسیەتی واجب: ئەویش ئەو وەسیەتەیە کە بیکات بۆ هەموو ئەو هەق و مافانەی لەسەریەتی، و بۆ ئەو هەق و مافانەشی کە بەسەر خەڵکیوەن، وەک قەرزو سپاردە، چی بەسەر خۆیەوە بن، یان مافی خۆی بێت و لای خەڵکی تربن، تاوەکو ئەستۆی خۆی پاک بکاتەوە لە قەرزو مافی خەڵکی، یان ماڵ و سامانی خۆی لە فەوتان و تیاچوون بپارێزێت.

دووەم : وەسیەتی سوننەت (مستحب): مەبەست لەو وەسیەتەیە کە مرۆڤ بیکات بۆ ئەوەی لەپاش مردنی بڕێک لە ماڵەکەی بکرێت

بە خێرو سەدەقە، جا بدرێت بە هەژاران، یان بخرێتە ناو پرۆژەیەکی خێرخوازی وەک دروستکردنی مزگەوت و نەخۆشخانە و قوتابخانە بۆ فێربوونی قوتابیان .

سێیەم : وەسیەتی حەرام: ئەو وەسیەتەیە کە وەسیەتکار وەسیەت بکات بەوەی ماڵ وسامانەکەی لە شتێکی گوناهو بێ شەرعیدا خەرج بکرێت .

چوارەم : وەسیەتی مەکروە (ناپەسەند): ئەو وەسیەتەیە کە کەسی وەسیەتکار کەسێکی هەژار بێت، یان ماڵ وسامانێکی کەمی هەبێت و لەهەمان کاتدا مناڵ و میراتگرانێکی هەژاری زۆری هەبێت و بچێت وەسیەت بکات بە بەخشینی ماڵەکەی بە خێرو سەدەقە، وە کەسەکانی بە هەژاری بەجێ بهێڵێت و ناچارین دەست لەکەسانی تر پان بکەنەوە.

خۆشەویستان: مرۆڤ دەتوانێت هەندێک وەسیەتی تایبەت بە خۆیشی بکات، وەک ئەوەی وەسیەت: بکات لەپاش مردنی فڵان کەسی ناسراوی خۆی بیشوات، یان فڵان مامۆستا نوێژی لەسەر بکات، یان وەسیەت بکات کە هیچ جۆرە بیدعەو کارێکی ناشەرعی لە تازیەکەیدا ئەنجام نەدرێت وەک شین وشەپۆڕی ئافرەتان و خزم و کەسوکارەکەی، بەتایبەت ئەگەر زانی کەسانێکی نزیک لەخۆی پاش مردنی کارێکی لەو شێوەیە ئەنجام دەدەن، هەروەک عەمری کوڕی

عاس (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێک لە سەرەمەرگدا بوو ئەم وەسیەتەی کرد: ﴿ فإذا أنا مت فلا تصحبني نائحة ولا نار﴾[٩]، واتا: ئەگەر مردم هیچ کەسێک بە شین و شەپۆرو ئاگر هەڵکردن شوێن جەنازەکەم نەکەوێت.

هەروەها سونەتە وەسیەتکار وەسیەت بکات لەکاتی لەشساغی و تەواوی عەقڵ وهۆشداری، نەک دوا بخرێت بۆکاتی نەخۆشی سەرەمەرگ و مردن ئەمجا فەرمان بکات بڵێت: وام بۆبکەن، وام بۆ بکەن.

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) ووتویەتی: ﴿ إذا مت فلا تضربوا علي فسطاطا، ولا تتبعوني بنار، وأسرعوا بي إلى ربي، فإني سمعت رسول الله ﷺ يقول : إذا وضع العبد أو الرجل الصالح على سريره، قال: قدموني قدموني، وإذا وضع الرجل السوء، قال: ويلكم أين تذهبون بي﴾[١٠]، واتا: ئەگەر مردم ڕەشماڵ و خەیمەم بۆ هەڵمەدەن، وە بە ئاگرکردنەوەوە شوێن جەنازەم مەکەون، چونکە من لە پێغەمبەری خودام بیستووە ﷺ کە فەرموویەتی: کاتێک

(٩) رواه مسلم .
(١٠) رواه أحمد.

کەسێکی پیاوچاک خرایە ناو دارە مەیتەوە، دەڵێت: زووکەن بمبەن و بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگار زوو بمگێڕنەوە بۆلای، بەڵام ئەگەر کەسێکی خراپەکار بوو، دەڵێت: وای بۆ ئێوە، ئەوە چیم لێ دەکەن و بۆ کوێم دەبەن؟.

زانایانیش وایان بە باش زانیوە کە ئەو وەسیەتی شەرعەیە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بێت، و ئەم خاڵانە لەخۆ بگرێت :

**یەکەم** : وەسیەت دەکەم بەوبڕە پارەیە (ناوی مەبلەغەکە بهێنێت و دیاری بکات) بۆ دۆستان و خزمان و کەسانی نزیکم، یان بۆ هەژاران و نەداران و چاپکردنی پەرتووکی ئایینی، یان وەقفکردنی بۆ پرۆژەی خێرخوازی نەبڕاوە، وەک دروستکردنی مزگەوت و نەخۆشخانە و پردو قوتابخانەی زانستە شەرعیەکان و بنکەکانی فێربوون و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزو یارمەتی قوتابیانی هەژارو شوێنی حەوانەوە بۆهەژارو ڕێبوارانی توێشو لێبڕاو(بەڵام نابێت ئەم مەبلەغە لە سێیەکی ماڵ وسامانەکەی زیاتر بێت، وەنابێت بۆ کەسانێک بێت کە بەپێی شەرع میراتی لێ ببەن).

یا زانایەکی شەرعی وەسیەت بکات بڵێت: کتێبەکانم وەقف بێت بۆ فلانە کتێبخانەی گشتی خەیری (بەتایبەتی ئەگەر کوڕی یا میراتگرێکی خوێندەواری نەبێت پێویستی پێ بێت) بۆئەوەی موسڵمانان بەگشتی وقوتابیانی زانستە شەرعیەکان

بەتایبەتی سوودی لێ وەربگرن.

**دووەم:** وەسیەت دەکەم لەکاتی سەرەمەرگمدا کۆمەڵێک لە پیاوچاکان ئامادەبن، بۆ ئەوەی لەو کاتەدا گومان باشی (حسن الظن)م بەرامبەر بە خودا بیربخەنەوە.

**سێهەم:** وەسیەت دەکەم کە لەکاتی سەرەمەرگمدا ووشەی (لا الە الا اللە)م بخەنە سەر زمان بەنەرمی وهێمنی، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لقنوا موتاكم لا إله إلا الله ﴾[11]، واتا: مردووەکانتان بە (لا اله الا الله) تەلقین بدەن لەکاتی سەرەمەرگدا، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ من كان آخر كلامه لا إله إلا الله دخل الجنة ﴾[12]، واتا: هەرکەسێک کۆتا ووشەی لە دونیادا: (لا اله الا الله) بێت دەچێتە بەهەشتەوە.

**چوارەم:** وەسیەت دەکەم کەسانێکی شارەزاو پیاوچاک وئەمین و ئاگادار بە ئەحکام و ئادابەکانی مردوو شوشتن بمشۆرن، بە شێوەیەک کە هاوتا بێت لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ،

---

(١١) رواه مسلم.

(١٢) حديث حسن رواه الحاكم.

وە ئەگەر شتێکی ناشیرین و عەیبێکی بینی بەلاشەکەمەوە بیشارێتەوە و باسی نەکات لای هیچ کەس لەبەر خاتری خودا.

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿من غسل ميتا فكتم عليه طهره الله من ذنوبه، فإن كفنه كساه الله من السندس﴾[١٣]، واتا: هەرکەسێک مردووێک بشوات و هەر کەموکورپیەکی پێوە بینی بیشارێتەوە خوای گەورە خاوێنی دەکاتەوە لە گوناهەکانی، وە ئەگەر کفنیشی کرد ئەوە خوای گەورە جلو بەرگی ئاوریشمی نەرم و نۆڵی لەبەر دەکات لە بەهەشت دا.

**پێنجەم**: وەسیەت دەکەم کە ئەو کفنەی لەبەرم دەکەن ڕەنگی سپی بێت و گوڵاوی لێبدەن چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ألبسوا من ثيابكم البياض، فإنها من خير ثيابكم وكفّنوا فيها موتاكم﴾[١٤]، واتا: جلوبەرگی سپی لەبەربکەن چونکە لە چاکترین جلو بەرگتانە، و مردووەکانتانی تێدا کفن بکەن.

**شەشەم**: وەسیەت دەکەم کە ئامادەبووانی سەر گۆڕم پاش

---

(١٣) رواه الطبراني في المعجم الكبير.
(١٤) رواه الترمذي.

شاردنەوەم نزاو دوعای خێرم بۆبکەن، چونکە پێغەمبــەری خوا ﷺ پاش بەخاک سپاردنی مردوو لەسەر گۆڕەکەی ڕادەوەستاو دەیفەرموو: ﴿ استغفروا لأخيكم وسلوا له التثبيت فإنه الان يسأل ﴾[١٥]، واتا: داوای لێخۆش بوون بۆ براکەتان بکەن، وە بپاڕێنەوە لە خوا کە زمانی دامەزراو بێت لە وەڵامدانەوەی فریشتەکان، چونکە کەمێکی تر پرسیاری لێ دەکرێت.

وە هەروەها وەسیەت دەکەم کە ئامادەبوانی کاتی ناشتنم پاش شاردنەوەم بە ئەندازەی سەربڕینی قوربانیەک و دابەشکردنی گۆشتەکەی بەسەر هەژاراندا بمێننەوە تاوەکو دڵم پێیان خۆش بێت، وە وەڵامی فریشتەکانی پەروەردگار بدەمەوە.

قال عمر بن العاص رضي الله عنه في ولايته عند الموت : (( ...فَإِذَا دَفَنْتُمُونِي، فَشُنُّوا عَلَيَّ التُّرَابَ شَنّاً ، ثُمَّ أَقِيمُوا حَوْلَ قَبْرِي قَدْرَ مَا تُنْحَرُ جَزورٌ، وَيُقْسَمُ لَحْمُهَا، حَتَّى أَسْتَأْنِسَ بِكُمْ، وَأَنْظُرَ مَا أُرَاجِعُ بِهِ رسُلَ رَبِّي ))[١٦] ، واتا: عەمری کوڕی عاس (خوای لێ ڕازی بێت) لە وەسیەتنامەی نزیک سەرەمەرگیدا ووتویەتی: ((...هەر کاتێک منتان ناشت وردە وردە خۆڵ بکەن بەسەرمدا، ئەمجا

---

(١٥) حديث صحيح رواه الحاكم .

(١٦) رواه مسلم .

لەدواییـدا بەئەنـدازەی سـەربڕینی ووشـترێک و دابەشـکردنی گۆشتەکەی لەسەر گۆڕەکەم بمێننـەوە، بۆ ئـەوەی دڵـم پێتـان خۆش بێت، وە بـزانم چۆن وەڵامـی فریشـتەکانی پـەروەردگارم دەدەمەوە)).

**حەفتەم:** وەسـیەت دەکـەم کـە زۆر بەپەلـە هـەرچی قـەرزو مـافی خەڵکیـە بەسـەرمەوە بیدەنـەوە پـێش ئـەوەی بمنێـژن، وە داوا بکەن لەو کەسانەی کە قەرزیان لەسەرمە پڕ بەدڵ گەردنم ئازاد بکەن تاکو لە چونە ناو بەهەشـت ڕێگـریم لـێ نـەکرێ، چونکـە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿ نفـس المؤمـــن معلقـــة بدينــه حتى يقضــى عنه ﴾[١٧]، واتا: ڕۆحی باوەڕدار لـە گـۆڕدا بەسـراوەتەوەو بـە بەهەشـت شـاد نابێـت لـەبـەر ئـەو قـەرزەی لەسەریەتی، هەتاوەکو بۆی دەدرێتەوە.

**هەشتەم:** وەسیەت دەکەم کە لەکاتی بەڕێکردنی جەنازەکەمـدا بـێ دەنـگ بـن و هێمنـی بپـارێزن، وە بـا نوێژخوێنـەکانی سـەرم زۆربن، وە نزای خێرم زۆر بۆ بکەن .

**نۆیەم:** وەسیەت دەکەم بۆکەسوکارم – بەتایبـەتی ئافرەتـەکان – کە ڕازی بن بە قەزاو قەدەری خوای گەورە و دوور بکەونەوە لە

(١٧) حديث صحيح رواه أحمد .

ئەنجامدانی هەر کارێکی ناشەرعی بۆم، وەک گریانی زۆرو شینو شەپۆرو یەخەی خۆ دارنین، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لیس منا من ضرب الخدود وشق الجیوب ودعا بدعوى الجاهلية ﴾[١٨]، واتا: لە ئێمە نییە ئەو کەسەی کە بۆ مردووان لە ڕومەتی خۆی بدات، وە یەخەی خۆی دابدڕێت، وە بە بالۆرەو هات و هاواری نەفامی هاوار بکات، وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إن الميت يعذب في قبره بما نيح عليه ﴾[١٩]. واتا: بێگومان مردوو لەناو گۆڕەکەی سزا دەدرێت بەهۆی ئەو شینو شەپۆڕ و گریانەی لەسەری دەکرێت. ئەمەش زانایان وایان لێک داوەتەوە، ئەگەر هاتوو ئەو کەسە لە ژیانی زانیبێتی خزمو کەسوکارەکەی پاش مردنی کارێکی لەو شێوەیەی بۆ دەکەنو وەسیەت نەکات شتی وا نەکەن، بۆیە واجبە لەم کاتەدا ئەو وەسیەتە بکات بۆ کەسوکارەکەی کە پاش مردنی کاری واناشەرعی نەکەن.

وە تکا دەکەم لە کەسوکاری خۆشەویستم ڕێگەنەدەن ئافرەتی سەردولکەبێژ پیاهەڵدان ولاواندنەوەم بۆبکات، چونکە

---

(١٨) رواه البخاري.

(١٩) رواه البخاري .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم کارەی حەرام کردووە[٢٠]، وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەم جۆرە ئافرەتەش فەرمویەتی: ﴿ النَّائِحَةُ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ ﴾[٢١]. واتا: ئەو ئافرەتەی مردوو دەلاوێنێتەوە ئەگەر تەوبەنەکات پێش مردنی، ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا کاتێک زیندوو دەکرێتەوە کراسێکی لەبەر دایە لەقەترانە، (مادەیەکی ڕەشی بە گڕو گەرمە بەسادەترین شێوە ئاگر دەگرێت، بۆیە وشتری گەڕی پێ چەور دەکرێت) واتە: جەستەی هەموو توشی خوران دەبێت.

**دەیەم:** وەسیەت دەکەم کە پاش مردن و گیان دەرچوونم بەپەلە بەخاکم بسپێرن و هەواڵی مردنم بگەیەنن بە کەسو خزم و خۆشەویستان و پیاوچاکانی هاوڕێم، بۆ ئەوەی بەشداربن لە شۆردن و کفن و نوێژ لەسەرکردن و بەخاک سپاردنم، تاوەکو ئەوان بەشداربن لەو خێرە گەورە و نزای خێرو لێخۆشبوونیش بۆ من بکەن.

**یازدەیەم:** وەسیەت دەکەم بۆکەسوکارم کەڕێگەنەدەن بەهیچ شێوەیەک ئافرەتان (با نزیکترین کەسیشم بن) لەگەڵ

---

(٢٠) رواه أحمد والترمذي وابن ماجه.

(٢١) رواه مسلم.

جەنازەکەمدا بێن بۆسەر قەبران، چونکە ئەمە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) وتویەتی: « خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم ، فَإِذَا نِسْوَةٌ جُلُوسٌ ، فَقَالَ : مَا يُجْلِسُكُنَّ ؟ قُلْنَ : نَنْتَظِرُ الْجَنَازَةَ ، قَالَ : هَلْ تَغْسِلْنَ ؟ قُلْنَ : لاَ ، قَالَ : هَلْ تَحْمِلْنَ ؟ قُلْنَ : لاَ، قَالَ : هَلْ تُدْلِينَ فِيمَنْ يُدْلِي ؟ قُلْنَ : لاَ ، قَالَ : فَارْجِعْنَ مَأْزُورَاتٍ غَيْرَ مَأْجُورَاتٍ »[٢٢]، واتا: پێغەمبەری خوایە ﷺ، چوە دەرەوە بینی چەند ئافرەتێک دانیشتون، فەرموی: بۆچی دانیشتون؟ وتیان: چاوەڕێی ئەم جەنازەیەین، فەرموی: ئایا ئێوە دەیشۆن؟ وتیان: نەخێر، فەرموی: ئایا هەڵیدەگرن؟ وتیان: نەخێر، فەرموی: ئایا ئێوە لەوانەن دەیانخەنە ناو گۆڕەوە؟ وتیان: نەخێر، فەرموی: دەبگەڕێنەوە گوناهبار دەبن و خێرتان ناگات، کەواتە تاوانباردەبن بە ڕۆیشتنتان و هیچ پاداشتان ناگات لەوەی ئامادە بن لە شاردنەوەی مردوودا.

**دوازدەیەم:** وەسیەت دەکەم پاش ئەوەی دڵنیا بوون لەوەی گیانم دەرچووە، چاوەکانم بەنەرمی دابخەن و ڕووم لە قیبلە بکەن،

(٢٢) رواه ابن ماجه.

**پاشان بە پۆشاکێکی سووک کە هەموو لاشەم بگرێتەوە جگە لەو پۆشاکەی کە لەبەرم بووە دامپۆشن، ئەم نزایەم بۆ بکەن و بڵێن :** ﴿ اللّٰهُمَّ اغفر لفلان **(ناوەکەم بڵێن)**، وارفع درجته في المهدين، وأخلفه في عقيبه في الغابرين، واغفر لنا وله يارب العالمين، وافسح له في قبره، ونور له فيه ﴾[٢٣]، **واتا: پەروەردگارا لە گوناهی فلان کەس خۆشبە، و پلەی لای خۆت بەرز بکەرەوە و لەناو کەسانی هیدایەتدراواندا، وە لەپاش ئەو کەسێکی دڵسۆز جێ بهێڵە بۆ کەسوکاری و بیکەرە جێنشینی، وە لە ئێمە و لەویش خۆشبە، ئەی پەروەردگاری جیهانیان، ئەی خوایە گۆڕەکەی بۆ فراوان و ڕوناک و ڕۆشن بکەرەوە .**

**<u>سیازدەیەم</u> : وەسیەت دەکەم پاش مردنم ئەو کەسەی کە دروست نەبووە لە ژیانمدا سەرم هەڵبداتەوە و ماچم بکات، پاش مردنیش ئەوە نەکات.**

**<u>چواردەیەم</u> : وەسیەت دەکەم بۆتان لەو شوێن و جێگایەی کە مردم هەر لە گۆڕستانی ئەو شوێنەش بەخاکم بسپێرن، وە تەرمەکەم نەگوێزنەوە بۆ جێگایەکی تر مەگەر ناچار بن.**

---

(٢٣) رواه مسلم.

هەروەها وەسیەت دەکەم: لەگەڵ هەڵگرتن وبردنی جەنازەکەم هــیچ بیدعەیــەکی حــەرام وقــەبیح نەکــەن وەک: هــەڵگرتنی چەپکەگوڵ ودانانی لەسەر گۆڕەکەم، چونکە ئەمە عادەت و چاولێکەری غەیرە موسڵمانەوبەفیرۆدانی ماڵەوخۆهەڵکێشان و بەخۆدانازینە.

**پازدەیەم:** وەسیەت دەکەم کە پاش مردنم چلەی ماتەمینیم بۆ نەگێڕدرێت و کەسانی نزیکم وەک دایک و خوشکەکانم پۆشاکی ڕەش نەپۆشن، تازیەداری و ماتەمینیم بۆنەکەن لە سێ ڕۆژ زیاتر، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لا يَحِلُّ لامْرَأةٍ تُؤمِن بالله واليَوم الآخِر أن تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْق ثَلاثٍ إلا عَلَى زَوْج أربَعَةَ أشْهُر وَعَشْرا﴾[٢٤]، واتا: دروست نیە بۆ هیچ ئافرەتێک باوەڕی بەخوداوبەڕۆژی دوایی هەبێت زیاتر لە سێ ڕۆژ ماتە مینی بگێڕێت بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێردی کە چوار مانگ و دەڕۆژە -پێویستە ئافرەتی مێردمردوو ئەم ماوەیە تازەیەدار بێت-.

**شازدەیەم:** وەسیەت دەکەم گۆڕەکەم لەپاش مردنم نەکرێت بە

---

(٢٤) رواه البخاري ومسلم.

جێگای کۆبونەوەو بۆنە گێران، وە هەروەها وەسیەت دەکەم زیاتر لە بستێک خۆڵی سەر گۆڕەکەم بەرز نەکەنەوە، و بێشکەو قەفەسی ئاسنینی لەسەر دروست نەکەن، وە بەهیچ شێوەیەک ئایەت و فەرموودەو شتی تریش وەک هۆنراوە و پەخشان لەسەر کێلەکەی نەنوسن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لەوەها کارێک وەک لە ڕیوایەتی ئیمام تورموزی و حاکمدا هاتووە ﴿نهى رسول الله ﷺ أن يكتب على القبر شيء﴾[٢٥]، واتا: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لەوەی هیچ شتێک لەسەر گۆڕ بنوسرێت .

**حەڤدەیەم:** وەسیەت دەکەم بۆکەسوکارم کە لە خودا بترسن و هەر کێشەو ناخۆشیەکی نێوان خۆیان چارەسەر بکەن بە ئاشتەوایی و لە فەرمانی خوای گەورەو پێغەمبەر ﷺ دەنەچن و ئەو ماڵ و سامانەی کە جێی دەهێڵم بەشێوەیەکی شەرعی و بەپێی قورئان و سوننەتی سەحیحی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان مێراتگرانمدا دابەش بکرێت، وە بەهیچ شێوەیەک ستەم لە هیچ کەسێکتان نەکەن، بەتایبەتی لە کچەکان.

---

(٢٥) رواه الترمذي والحاكم .

**هەژدەیەم:** وەسیەت دەکەم بۆکەسوکارومیراتگرانم ئەوا من جێتان دێڵم و کردەوەی خێرو چاکەم کۆتایی دێت تەنها لەو کردەوە چاکانەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ دیاری کردووە نەبێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ: إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ﴾[٢٦]، واتا: ئەگەر مرۆڤی (مسوڵمان) مرد کردەوەی کۆتایی پێدێ مەگەر لە سێ شتەوە نەبێت: خێرێکی بەردەوام، یان زانیاریەک سوودی لێ وەربگیرێ، یان منداڵێکی چاک دوعای بۆ بکات.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ مِمَّا يَلْحَقُ الْمُؤْمِنَ مِنْ عَمَلِهِ وَحَسَنَاتِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ: عِلْمًا عَلَّمَهُ وَنَشَرَهُ، وَوَلَدًا صَالِحًا تَرَكَهُ، وَمُصْحَفًا وَرَّثَهُ، أَوْمَسْجِدًا بَنَاهُ، أَوْ بَيْتًا لِابْنِ السَّبِيلِ بَنَاهُ، أَوْ نَهْرًا أَجْرَاهُ، أَوْ صَدَقَةً أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِهِ فِي صِحَّتِهِ وَحَيَاتِهِ يَلْحَقُهُ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ﴾[٢٧]، واتا: لەو شتانەی کە ئیماندار پێی دەگات لەکردەوە چاکەکانی دوای مردنی خۆی: (١) زانستێکی- بەسوود – کە فێری بوبێت و خەڵکانی تری

---

(٢٦) أخرجه مسلم.

(٢٧) رواه ابن ماجه وابن خزيمة .

فێرکردبێـت و بـڵاوی کردبێتـەوە، (٢) وە هـەروەها کـوڕێکی چاکەکاری لەدوای خۆی بەجێهشتبێت، (٣) وە یاخود قورئانێکی لەدوای خۆی بەجێهێشتبێت، (٤) وە یاخود مزگەوتێکی دروست کردبێت، (٥) یاخود خانوویەکی بۆڕێبوار دروست کردبێت، (٦) وە یـاخود جۆگەیـەکی هەڵبەستبێت کەخەڵکی سوودی لێ ببینن، (٧) وە یـاخود خێرو چاکەیـەکی بـەردەوام لـە مـاڵ و سامانی خۆی ئـەنجام دابێت لـەکاتی لـەش ساغی و ژیانی دونیاییدا وە لەدوای مردنیشی بەردەوام بوبێت.

جا تکا کارم لـە کەسوکاری ئـازیزو خۆشەویستم لـە پشکی گەورەی ئەم خێرو خێراتانە بێبەشم نەکـەن، زۆر بەدڵسۆزیەوە بۆم ئەنجام بدەن، چونکە من ئێستا زۆر چاوم لەدەستی خێری ئێوەیـە، زۆر زۆر پێویست و هـەژارم بۆکـاری چاکـەو ڕەحمـی خودا، توخوا لەبیرم نەکەن، ئێستا کـاتی خۆشەویستیتانە بـۆ من، کاتی وەفاداریتانە بۆ من.

**<u>نۆزدەیەم:</u>** پێتان ڕادەگەینم و دەتانکەم بە شاهید لای خوای گەورە کە من گەردنی هەموو کەسێکم ئازاد کردوە، و لە هەموو هەقێکی خۆم خۆش بووم، وە بۆیـە داوا لـەئێوەش دەکـەم کـە گـەردنی من ئازاد بکەن ئەگەر هەر هەقێکتان بەسەر منەوە هەبێت.

**<u>بیستەم:</u>** دوا وەسیەتیشـم بۆتـان هـەمان وەسـیەتی پێشـەوای

مرۆڤایەتیە ﷺ کە وەسیەتی کرد بۆ ئوممەتەکەی لە خوا بترسن و پارێزگاربن و ئاگاداری نوێژەکانیان بن و ستەم لە ژنان نەکەن، وەک ئیمام ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە، کە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەمەرگدا فەرمووی : ﴿الصلاة، الصلاة، اتقوا الله فيما ملكت أيمانكم﴾[٢٨]، واتا: ئاگاداری نوێژەکانتان بن، ئاگاداری نوێژەکانتان بن، لە خوا بترسن لەوەی ستەم لە ژن و خزمەتکار و بەردەستەکانتان بکەن.

**بیست ویەکەم:** وەسیەت دەکەم و ئومێدەوارم کە پەندو عیبرەت وەربگرن لە مردنی من، ئەوا من بە یەکجاری ماڵئاوایتان لێدەکەم تا ڕۆژی قیامەت بەیەک دەگەینەوە، من بەتاقی تەنها جێدەهێڵن لەناو ئەم گۆڕەدا، ئێوەش دەگەڕێنەوە بۆلای ماڵ و کەسوکارتان، کەستان ناتوانن لام بمێننەوە بۆکاتێکی کەمیش، من ئێستا لێپرسینەوەم دەست پێ دەکات و نازانم سەرئەنجامم چی لێدێت؟ خوا ڕەحمم پێبکات، بۆیە دەڵێم: تەوبە بکەن، تەوبە بکەن، بگەڕێنەوە بۆلای خودا.

**بیست ودووەم:** لەپێشەکی وەسیەتەکەدا ئەمە دەنوسێت:

---

(٢٨) رواه أبو داود.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: (( كَانُوا يَكْتُبُونَ فِي صُدُورِ وَصَايَاهُمْ هَذَا مَا أَوْصَى بِهِ فُلاَنُ ابْنُ فُلاَنٍ، أَوْصَى أَنَّهُ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لاَ رَيْبَ فِيهَا، وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُورِ، وَأَوْصَى مَنْ تَرَكَ بَعْدَهُ مِنْ أَهْلِهِ أَنْ يَتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ، وَأَنْ يُصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِهِمْ، وَيُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ، وَأَوْصَاهُمْ بِمَا وَصَّى بِهِ إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ ﴿ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾[٢٩])).

**ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: هاوەڵان لە پێشەکی وەسیەتەکەیاندا ئەمەیان دەنوسی: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، ئەمە ئەو وەسیەتەیە کە فلانی کوڕی فلان کردوویەتی، شایەتی ئەدات کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوای تاک و تەنهای بێ هاوەڵ، وە موحەمەدیش ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە، وە بێگومان ڕۆژی دوایی دێت و گومانی تێدا نییە، وە بەڕاستی خوا هەموو ئەوانەی لە گۆڕەکاندان زیندوویان دەکاتەوە، وە وەسیەت بکات بۆ ئەو کەسوکارەی**

---

(٢٩) رواه الدارقطني والبيهقي.

لێی بەجێماوون لەخوا بترسن و نێوانیان چاک کەن و گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بن، ئەگەر باوەڕدارن وەسیەتیان بۆ بکات بەو وەسێتەی کە ئیبراهیم و یەعقوب -علیهما السلام- وەسیەتیان پێکرد بۆ کوڕەکانیان کە وتیان: (ڕۆڵەکانم بێگومان خوا ئایینی ئیسلامی بۆ هەڵبژاردوون، کەواتە بە موسڵمانیەتی نەبێت مەمرن).

**بیست و سێیەم** : لە پێش کۆتاییدا نوسەری ئەم وەسیتنامەیە بنوسێت: ئەمە وەسیەتنامەی شەرعی منە، بەندەی هەژاری بەردەم قاپی ڕەحمەتی خودا بۆ کەسوکارەکەم، داواکارم لێتان کە بەتەواوی جێ بەجێی بکەن، وە لای خوا گەردنی ئەو کەسە ئازاد ناکەم کە هیچ بڕگە و بابەتێکی ئەم وەسیتنامەیە بگۆڕێت یان دەستکاری بکات، چونکە خوای گەورە دەربارەی وەسیەتی وەسیەتکاران فەرموویەتی: ﴿ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَمَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾[٣٠]، واتا: هەرکەسێک وەسیەتەکەی گۆڕی دوای بیستنی (یان خوێندنەوەی) ئەوە گوناهی هەر لە گەردنی ئەو کەسانەدایە کە دەیگۆڕن، بێگومان خوای گەورەش بیسەری زانایە.

---

(٣٠) البقرة : ١٨١ .

**لە کۆتاییدا:** نوسینی بەرواری وەسیەت نامەکە پێویستە، وە واچاکە بنوسرێت بەم شێوەیەی خوارەوە بێت:

ئەم وەسیەتە نووسراوە لە ڕۆژی (..........) وە لە مانگی (........) وە لە ساڵی (..........) .

وەسیەتکار :

ناوی سیانی : ( ........................ )

ناونیشان : ( ........................ )

مۆرو ئیمزا : ( ..................... )

شاهیدەکان و ئیمزاکانیان :

شاهیدی یەکەم : ( ......................)

شاهیدی دووەم : ( ......................)

لە کۆتاییدا تکا دەکەم لە خوێنەری بەڕێز لە خوشکان و برایانم لە دوعاو نزای خێر بێبەشمان نەکەن .

وە زۆر سوپاس و دوعای خێر دەکەم بۆ برای ئازیزم مامۆستا: (ئومێد عمر علی چروستانی) دەکەم کە یارمەتی دام لە تایپ و نەخشەسازی و پێداچوونەوەی ئەم نامیلکەیە.

## دوا ووشە

ئەو کەسەی وەسیەت دەکات بە سێ یەکی ماڵەکەی جا خانوو بێت یا زەوی و باغ و دوکان و باڵەخانەو ئەو جۆرە موڵکانە بۆ وەقف و خێراتی بەردەوام پێویستە بچێتە لای دادوەر لە دادگای باری کەسی ئەم وەسیەتنامەیە تۆمار بکات بە فەرمی بە مۆرو ئیمزای شاهیدو دادوەر ؛ تاکو کەس نەتوانێت نکوڵی بکات لە ڕاستی وەسیەتنامەکە ؛ وە تاکو هیچ گرفت و کێشە نەبێت بۆ جێبەجێکردنی ؛ چونکە ئەو وەسیەتنامە جێگیر بووە بە پێی شەرع و یاسا ئەبێت جێبەجێ بکرێت .

وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

## سەرچاوەکان


١-القرآن الكريم.
٢- صحيح البخاري.
٣- صحيح مسلم.
٤- سنن ابو داود.
٥- سنن الترمذي.
٦- سنن ابن ماجه.
٧- سن النسائي.
٨- مسند الإمام أحمد بن حنبل.
٩- المستدرك للحاكم.
١٠- السنن الكبرى للبيهقي.
١١- صحيح ابن خزيمة.
١٢- المعجم الكبير للطبراني.
١٣- شرح النووي على صحيح مسلم.
١٤- سنن الدار قطني.
١٥- الفقه الإسلامي وأدلته للدكتور الزحيلي.
١٦- الموسوعة الفقهية الكويتية.